خەریک بووم دەڕۆیشتم ئەو شاعیرە گەورەیە ببینم. پیاوێک کە دوای "جێفێرز" گەورەترین شاعیری کات بوو و بە حەفتا ساڵ تەمەنەوە، شاعیرێکی نێونەتەوەیی بوو بە شێعری وەک "خەمی من لە خەمی تۆ باشترە، هاها" و "ئادامسێکی مردووی هەناسەبڕکێ". لە زۆریەک لە زانکۆکاندا کورسی مامۆستایی هەیە و خەڵاتی زۆری وەرگرتووە، وەکوو خەڵاتی نۆبێل. لە پێپلیکانی کڵابی لاوان وەسەر کەوتم، ئاغای "ستاچمەن" لە ئاپاڕتمانی ژمارە ٢٢٣ دەژیا. لە دەرگام دا. یەکێک لە پشت دەرگاوە هاواری کرد: "شەیتان بە نەعلەت، وەرە ژوور". دەرگام کردەوە و ڕۆیشتمە ژوورەوە. "بێرنارد ستاچمەن" لە جێخەوەکەیدا ڕاکشابوو. بۆنی ڕشانەوە، شەڕاب، میز، پیسایی و خۆراکی بۆگەنیو هەموو وڵاتی داگرتبوو. بە هەڵاتن ڕۆیشتمە ئاودەست، ڕشامەوە و دواتر گەڕامەوە.

گوتم : "ئاغای ستاچمەن، بۆ پەنجەرەکان ئاوەڵە ناکەی؟".

گوتی : "فکری چاکە، ئیتر ئەو قسە قۆڕانەش مەکە، من "بێرنی"م، نەک ئاغای ستاچمەن".

ئەو کە فەلەج بوو، دوای هەوڵێکی زۆر توانی خۆی لە جێخەو بخاتە دەرەوە و لەسەر کورسی دانیشێ. دواتر گوتی: "زۆر باشە، گفتگۆیەکی خۆش، چاوەڕێی بووم".

لە سەر مێز، لە کەنار ئەژنۆی، دەفرێکی شەڕابی پڕ لە سووتووی جگەرە و پەپوولەیەکی مردووی لێ بوو. چاوێکم لە دەورووپشتم کرد و دواتر کە سەرلەنوێ سەرنجم دایە، دیتم کە لە دەفرە شەڕابەکە دەخواتەوە، هەڵبەت زۆربەی بە سەر

شەڵوار و کراسەکەیدا دەڕژا. بێرنارد ستاچمەن دەفرەکەی لە شوێنی خۆی داناوە و گوتی: "ئۆخەی، تەنیا پێویستیم بەوە بوو". پێم گوت : "ئەگەر بە لیوان بخۆیەوە ئاسوودەتری". گوتی : "وایە، فکر دەکەم کە تۆ ڕاست بکەی".

چاوێکی لە چواردەوری کرد، چەند دانە لیوانی چڵکن و پیس لەوێ بوون، فکرم کردەوە کە بڵێی کامیان هەڵگریْ؟ پیسترین لیوانی هەڵگرت، چڵکێکی زەرد بنی لیوانی گرتبوو کە وێدەچوو بەرماوی شلەی مریشک بێ. شەڕابی لە لیوان کرد و بە سەرییەوە نا. دواتر گوتی : "وایە، ئاوا زۆر باشترە. کامێرات لەگەڵ خۆت هێناوە؟ دەتهەوێ وێنەم لێ بگری؟".

دواتر ڕۆیشتم پەنجەرەم کردەوە تا تۆزێک هەوای تازە هەڵلووشم. چەند ڕۆژ بوو باران دەباری و هەوا تازە و خاوێن بوو. گوتی : "گوێ بگرە، من چەند ڕۆژە دەمهەوێ میز بکەم، دەفرێکی بەتاڵم بۆ بهێنە". پڕ بوو لە دەفری بەتاڵ. یەکیانم هەڵگرت و دامە دەستی. شەڵوارەکەی زیپی نەبوو، دوگمەیی بوو. تەنگاو بوو، تەنیا دوگمەی سەرەوەی کردەوە و دەفری خستە نێوان لاقەکانی. بەڵام وا دیار بوو دروستی نیشانە نەگرتبوو و کاتێک دەستی کرد بە میزکردن، بە هەموو وڵاتدا پڕژا. سەر کراسەکەی، سەر دەموچاوی، و بە چڕی نێو گوێی چەپی. گوتی: "نەفرەت لە شەل بوون و پەککەوتوویی".

- بۆ ئاواتان لێ هاتووە؟

- چۆن؟

- فەلەج بوون.

- هاوسەرەکەم بە ئۆتۆمبیل لێی دام.

- چۆن؟ بۆ؟

- گوتی ئیتر ناتوانێ بەرگە بگرێ و بەردەوام بێ لەگەڵم.

من ئیتر هیچم نەگوت و چەند دانە وێنەم گرت.

گوتی: "چەند وێنەم لە هاوسەرەکەم هەیە، دەتهەوێ بیانبینی؟".

- بەڵێ.

- ئەلبۆم لەوێ، لەسەر یەخچاڵە.

هەستام ئەلبۆمم هەڵگرت و سەر لە نوێ دانیشتمەوە. وێنەکان هەموو تەنیا لە کەوشی پانێ بلێند، گۆزنگی لاق، گۆرەوی ژنانەی نایلۆنی بەنددار و حاڵەتی جۆراجۆری لاقی پۆشراو بە گۆرەوی ژنانە بوون. لەسەر هێندێک لە لاپەڕەکانیش، کاغەزی پەیوەندیدار بە قەسسابی جۆراجۆر لکابوو. گۆشتی کەبابی، هەر کیلۆ هەشتا و نۆ سێنت. ئەلبۆمەکەم داخست. گوتی: "ئەوەی کاتی جیابوونەوەمان پێ دام". دوایی دەستی خستە ژێر باڵنجەکەی و جووتێک کەوشی پانێ بلێندی لەوێ دەرهێنا. کەوشەکان دەدرەوشانەوە. لەسەر مێزی دانان و دووجارە شەڕابی بۆ خۆی تێکرد و گوتی : "من لەگەڵ ئەو کەوشانە دەخەوم، ئەویندارى و دەستبازییان لەگەڵ دەکەم و دوایی دەیانشۆم".

من چەند دانە وێنەی ترم گرت.

گوتی : " وێنەیەکی باشت دەوێ؟، وەرە ئەوەی بگرە".

کەوشەکانی بە دەستەوە گرت و لە پشتی ڕایگرتن. "وەرە وێنەم بگرە". وێنەم لێ گرت. بۆی ئەستەم بوو لەسەر پێ ڕاوەستێ، بەڵام بە هەر جۆرێکی بێ دەستی بە مێزەوە گرت و هەستا سەر پێ. گوتم:

- بێرنی تۆ هێشتاش دەنووسی؟

- من هەمیشە دەنووسم.

- لایەنگرەکانت بێزارت ناکەن؟

- هێندێک جار ژنان دەمدۆزنەوە. بەڵام زۆر لێرە نامێننەوە.

- کتێبەکانت باش دەفرۆشرێن؟

- من پووڵی نووسینی خۆم بە دەسترەنج وەردەگرم.

- چ ڕێنوێنییەکت بۆ نووسەرە لاوەکان هەیە؟

- بە باشی بخۆنەوە، بە تەنیا نەخەون و جگەرە زۆر بکێشن.

- ڕێنوێنیت بۆ نووسەرە بە ئەزموون و لێهاتووەکان؟

- ئەوانە ئەگەر هێشتا زیندوو مابن، پێویستییان بە ڕێنوێنی من نییە.

- چ مەیلێکە کە ڕاتدەکێشێ بۆ لای شێعر نووسین؟

- هەر ئەو مەیلەی تۆ ناچار دەکا بڕۆیە ئاودەست.

- بۆچوونت لە بارەی "ڕێگان" و بێکارییەوە چییە؟

- من بیر لە ڕێگان و بێکاری ناکەمەوە، ئەو شتانە وەڕەزم دەکەن، شتی وەک کریکێت و سەفەری ئاسمانی.

- ئەی بیر لە چی دەکەیەوە؟

- ژنە نوێخوازەکان.

- ژنی نوێخاز؟

- ئەوان نازانن چۆن جل بپۆشن. کەوشەکانیان بێداد ناحەزە.

- بۆچوونت لە بارەی مافی ژنان لە کۆمەڵگادا چییە؟

- هەرکات ئەوان ئامادە بوون لە کارگەی ئۆتۆمبێل شوشتندا کار بکەن، لە پشت گاسنەوە بڕۆن، لات و لووتان لە کافەکان وەدەر بنێن، لە نێو فازلاوەکاندا کار بکەن، هەرکات ئامادە بوون لە شەڕدا سینگیان بە گوللەوە بنێن، من لەماڵێدا دادەنیشم و قاپ و کەوچک دەشۆم و ڕاخەرەکان خاوێن دەکەمەوە.

- بەڵام وا فکر ناکەی کە خواستەکانی ئەوان لۆژیکییە و مافی خۆیانە؟

- بە دڵنیایی وایە.

- ستاچمەن سەر لە نوێ شەڕابی بۆخۆی تێکرد، بەڵام هەرچەند کە بە لیوان دەیخواردەوە، لەگەڵ ئەوەش تۆزێک لە لای لێوییەوە دەڕژا سەر کراسەکەی. لەشی بۆنی کەسێکی لێ دەهات کە چەندین مانگە حەمامی نەکردووە. گوتی: "هاوسەرەکەم، هێشتا خۆشم دەوێ، ئەو تەلەفونەم بدەیە". تەلەفونم دایە و ژمارەی گرت: "کلێیر، سڵاو کلێیر". دواتر تەلەفونەکەی داناوە.

پرسیم : "چی بوو؟".

- وەک هەمیشە پچڕاندی. گوێ بگرە، وەرە با بڕۆینە دەرێ، با بڕۆینە مەیخانەیەک، من لە مێژە لەو ژوورە نەفرەتییەدام. دەبێ هەوایەک بگۆڕم.

- بەڵام خەریکە باران دەباری، حەتوویەکە باران دەباری، شەقام هەموو پڕە لە ئاو.

- گرینگ نییە، من دەمەوێ بڕۆمە دەرەوە. ئەو هەڵبەت ئێستا خەریکە لەگەڵ کەسێک دەستبازی دەکا. هەڵبەت کەوشە پانێ بڵیندەکانیشی لە پێ کردووە. من هەمیشە ناچارم دەکرد کەوشی پانێ بڵێند لە پێ بکا.

من یارمەتیم دا تا بێرنارد ستاچمەن پاڵتۆ قاوەیی کۆنەکەی لەبەر بکا، پاڵتۆ دوگمەیەکی زیاتر نەبوو و لە بەر چڵکنی، ڕەق هەڵاتبوو. وێنەدەچوو پاڵتۆیەکی "لۆس ئانجلێس"ی بێ، قورس و ڕێگر بوو و وێدەچوو هی دەیەی سی یا چلی "شیکاگۆ" و "دێنڤێر" بێ. دواتر دارەکانی بن دەستیم دایە و یارمەتیم دا کە لە پلیکانەکانی کلاَبی لاوان دابەزێ. بێرنارد لە گیرفانیدا نیوە دەفرێکی شەڕابی "موسکاتێل"ی پێ بوو. کە گەیشتینە بەر دەرگا، گوتی بۆخۆی دەتوانێ لە شەقام بپەڕێتەوە و سواری ئۆتۆمبیل بێ.

ئۆتۆمبیلەکەم لەوبەری شەقام بوو. کاتێک خەریک بووم ئۆتۆمبیلەکەم دەهێنا، کتوپڕ گوێم لە دەنگی هاوار و دواتر شڵپەی ئاو بوو. باران دەباری، زۆر بە چڕی. هەڵاتمە دەرێ، بێرنارد لە جۆگەی کەنار ڕێڕەو کەوتبوو. هەروا کە دانیشتبوو، ئاو لە ژێری تێدەپەڕی و لە کەمەری دەئاڵا و شەڵوارەکەی دەخووساند. دارەکانی بن دەستی لە سەر ئاو دەهاتن و دەچوون.

گوتی: "گرینگ نییە، تۆ ئۆتۆمبیلەکەت هەڵگرە و بڕۆ".

- ئەوە دەڵێی چی بێرنی؟

- دەڵێم بڕۆ. هاوسەرەکەم خۆشی ناوێم.

- بێرنی ئەو ئیتر هاوسەری تۆ نییە، ئێوە جیا بوونەتەوە. دەستت بدە بە من و هەستە سەر پێ.

- نا تۆ بڕۆ، باوەڕ بکە من حاڵم باشە. بڕۆ بێ من مەست ببە.

هەڵمگرت، دەرگای ئۆتۆمبێلم کردەوە و لەسەر سەندەڵی پێشەوە دامنیشاند. هەموو جەستەی خووسابوو، ئاو خەریک بوو لە سەندەڵی دەڕژا ژێر ئۆتۆمبێل. من ڕۆیشتمە ئەو بەر و سواری ئۆتۆمبێل بووم. بێرنی دەرگای دەفری بوسکاتێلی کردەوە و قومێکی خواردەوە و دواتر دەفرەکەی دا بە من، منیش قومێکم لێ دا و دواتر ئۆتۆمبێلم هەڵکرد.

هەروا کە دەڕۆیشتم، لە پشت دڵۆپی بارانی سەر شیشە، چاوم لە دەرەوە بوو و چاوم بە دوای مەیخانەیەکەوە بوو. مەیخانەیەک کە تێیدا لەبەر بۆنی میز، هێڵنجمان نەیا.